www.youtube.com/alibapir1

زنجیرەی ئـاگایی ١٦

# چۆن لەگەڵ

# کۆمەڵی ئیسلامی بڕەین ؟


عەلی باپیر



www.alibapir.net

٢٠٢٠-١٤٤١

# چۆن گەشە بە
# کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟


ناوی نووسەر: **عەلی باپیر**

دیزاینی ناوەوەو بەرگ: **زەردەشت کاوانی**

خەتی بەرگ: **نەوزاد کۆیی**

نۆبەتی چاپ: **یەکەم ١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**




زنجیرەی ئاگایی (١٦)

# چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین ؟

عەلی باپیر

## ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

ناوەندێکە، لە پەیڕەوی نێوخۆی پەسندکراوی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان/عێراق ساڵی ٢٠١٥ وەکو یەکێك لە ئۆرگانە فەرمییەکانی حزب بڕیاری لەسەر دراوە و جێگیرکراوە. ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە گرنگیدان بە پەرەپێدانی تواناکان و پێگەیاندنی ئەندامان لە بوارە جیا جیاکان،و بایەخدان بە بواری ڕۆشنبیری و ڕاهێنان و گەشەپێدانی توانستەکانیان، بەمەبەستی دروستکردنی کادیر و سەرکردەی داهاتوو لە کایەی حزبی و حکومیدا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ
إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥ ﴾

المائدة: ١٠٥

# پێشکەش بێ

بەئەندامە دڵسۆزو مشوور خۆرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی بەگشتیی و، بەتایبەت ئەوانەی هەرچی زیاتر کار لەسەر باشتر تێگەیشتن و چاکتر پێگەیشتنی خۆیان دەکەن...

# پێشەكیی
## ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان وەك ئەركی سەرشانی و لە سۆنگەی خەمخۆریی و پەرۆشیی و خزمەتكردن بە كادیرو ئەندامان و بەرەوپێشچوونی زیاتری ئۆرگانەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی، هەروەها بەمەبەستی ئاشناو شارەزابوون بە دوایین تێڕوانین و دیدی بەڕێز مامۆستا (عەلی باپیر) لە بەرانبەر كۆمەڵێك پرس و بابەتی هەنووكەیی و هەستیار و چارەنووسساز و پەیوەست بە كایە جۆراوجۆرەكانی كاری ئیسلامیی و تایبەت بە ژیانی حیزبایەتییمان، لە بیری ئەوەدابوو بە چ پرۆژەو میكانیزم و تەكنیكێكی تازەوە، بەرخورد لەگەڵ ئەم دۆخە دژوارو نائاساییە بكات، كە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی كۆڕۆنا كۆڤید- 19 و كەرەنتین بوونی تەواوی شارو شارۆچكەكانی هەرێمی كوردستان بەمەبەستی خۆپارێزیی لە تووش بوون بەم ڤایرۆسە، هاتبووە ئاراوە.

بەڵێ لەم ساتەوەختە دژوارەدا ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان گرووپێكی ئەلیكترۆنی داخراوی بەناوی ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان دامەزراند، كە پێكهاتەكەی بریتی بوو لە

ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی ئەنجوومەنی سیاسیی و سەرکردایەتیی و کادیرانی باڵا تا ئاستی کارگێڕو ئەندامانی مەڵبەند.

مەبەست لە دروستکردنی ئەم گرووپە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بوو کە بە هۆی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆناوە دروست ببوو، کە سەرجەمی ئۆرگانەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی بەمەبەستی پابەند بوون بە ڕێنماییە تەندروستییەکان، کارو چالاکیی و کۆبوونەوەکانیان وەستاندبوو، بەمەش جۆرێك لە دابڕان دروست ببوو، لەو پێناوەدا ناوەند لە هەوڵی ئەوەدابوو لە ڕێگای ئەم گرووپەوە بە شێوازی ئۆنلاین جارێکی تر ئۆرگانەکان بەیەکەوە ببەستێتەوەو کەم و زۆر لەو ڕێگایەوە درێژە بە چالاکییەکانی بدات، ئەوەبوو کۆمەڵێك لایڤی بۆ بەڕێز جەنابی مامۆستا (عەلی باپیر) ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی سازکرد کە تیایدا چەند بابەتێکی گرنگ و پێویست و بە نرخی پێشکەشی ئەندامانی گرووپ کرد.

شایانی باسە لە ڕێگای ئەم گرووپەوە ناوەندەکەمان بەهەماهەنگی و هاوکاریی ڕاگەیاندنی مەکتەبی ئەمیر، توانرا پێنج بابەتی زۆر گرنگ و پڕ لە ناوەڕۆك پێشکەشی ئەندامانی بکات، بەم ناو و نیشانانەی خوارەوە:

١- (چەند سەرنج و هەڵوەستەیەك لەم بارودۆخەدا).

٢- (چەند هەڵوەستەیەكی ئیمانیی و فیكریی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی لەم هەلومەرجەدا).

٣- (هاوسەنگیی گرنگترین سیمای مسوڵمانەتییە).

٤- (مسوڵمانەتیی لە نێوان جەوهەرو ڕواڵەتدا).

٥- (چۆن كاری ئیسلامیمان بەهێزو پێزترو فراوانتر بكەین؟).

دیارە هەر بابەتەو بۆ خۆی دیراسەیەكی وردی چەند پرسێكی تایبەتی كردووەو، هەر هەمووشی بۆ ئەمڕۆی كاری ئیسلامیی زەروورو پێویستن، بەڵام ناوەند لە كۆی ئەم پێنج بابەتە، بابەتی: ((چۆن كاری ئیسلامییمان بەهێزو پێزترو فراوانتر بكەین؟) كە دواتر مامۆستا ناو و نیشانەكەی گۆڕی بۆ: (چۆن گەشە بە كۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟) هەڵبژارد، بۆ ئەوەی بیكات بە بابەتێكی زنجیرە نامیلكەی (ئاگایی) و دوای چاپكردنی بەسەر تەواوی ئۆرگانەكاندا دابەشی بكاو سەرجەمی ئەندامان لە ناوەڕۆكەكەی بەهرەمەند بكات.

چۆن گەشە بە كۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ ئەو پرسیارە جەوهەرییە كە بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر دەیەوێت سەركردەو كادیرو ئەندامان پێ بدوێنێ و لە میانەی چەند تەوەرو بنەمایەكەوە وەڵام بداتەوەو، پێمان بڵێت: بۆ ئەوەی

گەشە بە كۆمەڵ بدەین، پێویستە هەم خودی خۆمان و ناوخۆو دەرەوەی خۆشمان بناسین، چونكە دواجار ناسینی خودی خۆمان و جوانتركردنی ئەو كردەوەو ڕەوشت و ئاكارانەی كە زادەی ئەو خودەن، لەلایەك و ناسینی جم و جۆڵ و چالاكییەكانمان لە چوارچێوەی كاری ئیسلامیی لەلایەكی دیكەوە، پاشان چەسپاندنی لە عەقڵ و دڵی خۆمان و خەڵك و، ئنجا ڕەنگپێدانەوەی دینداریی و خواپەرستییمان لە ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی و فەرهەنگیی و...هتد، زامنی ئەوەن كە كۆمەڵی ئیسلامیی گەشە پێ بدەین و بە هێزو پێزترو فراوانتری بكەین.

ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

٢٠٢٠/٦/١٠

## پێشەکیی و ڕێخۆشکردن

الحمدلله رب العالمين، وصلى الله تعالى وسلم على محمد خاتم النبيين، المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

**براو خوشکە بەڕێزەکانم لە کۆمەڵی ئیسلامییدا!**

هەمووﻻیەکتان کەم و زۆر ئاگادارن کە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بارودۆخی هەرێمی کوردستان لە هەموو ڕووەکانەوە: سیاسیی و ئیداریی، ئابووریی و ژیان و گوزەران، کۆمەڵایەتیی و خێزانیی، فیکریی و ئاکاریی... بەرەو داڕووخان و بێ سەرەوبەرەیی و گێژاو دەچێ و، خەڵك و جەماوەر زیاتر تووشی نائومێدیی و دڵساردیی و ڕەشبینیی دەبن.

**بە پێچەوانەوەش لە بەرانبەردا:**

کۆمەڵی ئیسلامیی هەرچی زیاتر دەبێتە جێی هیواو ئومێد و متمانەی خەڵك و جەماوەرێکی زۆر کە چاویان بە چاوپێچك نەبەستراوە و، گەروویان بە شیرینیی پارە و خەڵات و بەراتی موفت و حەڕام نەگیراوە و، تا ڕادەیەك هۆشیاریی عەقڵ و بێداریی دڵ و دەروونیان ماوە!

بۆیە لە ئاوا حاڵێکدا ئێمەی مشوورخۆرو دڵسۆزانی ئەو تەوژمە ئیسلامییە ڕەسەنە، لەسەرمان پێویستە بەردەوام چاوێکی جیددیی "لە هەموو ڕوویێکەوە" بەخۆماندا بگێڕینەوەو، هەوڵی گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی زیاتر بدەین، تاکو زیاتر لە ئاستی چاوەڕوانیی و ئومێدی خێری خەڵکەکەمان دابین.

کە بێگومان ئەوەش پێویستی بەوە دەکات، هیممەتی زیاتر بخەینەکار، بۆ بەهێزو پێزتر کردنی کارو پڕۆژە ئیسلامییەکەمان و، سەرەنجام تواناداترکردنی بۆ فراوانبوون و زیاترو باشتر وە خۆگرتن (إستیعاب)ی هەموو ئەوانەی حەز دەکەن لێمان نزیك ببنەوەو، بە جۆرێك لە جۆرەکان هاوکارو دەستبارگرو هاوخەباتمان بن.

بۆیەش لە دوای پێشنیارکردنی (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) و چەند برایەکی دیکەی دڵسۆز، بە باشمانزانی ئەو وتارەی لە شەوی: (٢٠٢٠/٥/٢١ز)دا پێشکەشم کردن، دوای دەستپێداهێنانێکی کەم، لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا پێشکەشتانی بکەم و ناوونیشانەکەشمان لە: (چۆن کاری ئیسلامییمان بەهێزو پێزترو فراوانتر بکەین؟) گۆڕی بۆ: (چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟).

سوپاسی (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان)یش دەکەم کە ئەرکی تایپ کردن و بڵاوکردنەوەی ئەم نامیلکەیان وە ئەستۆ گرت.

**شایانی باسیشە ئەم نامیلکەیە لە پێنج تەوەر پێکهاتوە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:**

**تەوەری یەکەم:** پێناسەکردنی هەر سێ وشەی (کاری ئیسلامیی، بەهێزو پێزترکردنی کاری ئیسلامیی، فراوانترکردنی کاری ئیسلامیی ).

**تەوەری دووەم:** ئێمە خۆمان چۆن بین، کارەکەشمان ئاوا دەبێت.

**تەوەری سێیەم:** ڕوونکردنەوەی چەمکی: خودی خۆمان.

**تەوەری چوارەم:** سێ بنەمای گرنگ لە بواری نێوخۆییدا.

**تەوەری پێنجەم:** چوار بنەمای سەرەکیی لە بواری دەرەکییدا.

هەڵبەتە ئەمانە هێڵە گشتییەکان و ئەو چوارچێوەیەن، کە پێم وایە پێویستە لەم قۆناغ و هەل و مەرجەدا بۆ گەشەپێدان و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵی ئیسلامیی ڕەچاویان بکەین، بەڵام درێژەی ئەو بابەتە لە کتێبی: (هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی )دا هاتوە، کە پێشتر چاپ و بڵاوکراوەتەوەو، خوا پشتیوان بێ جارێکی دیکەش پاش دەستکاریی، وەك ئاڵقەیەك و کتێبێك لە مەوسووعەی: (بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن)دا بڵاودەبێتەوە.

عەلی باپیر

١٧ شوال ١٤٤١ ك - ٢٠٢٠/٦/٩ ز




ڕوونکردنەوەی چەمکی:

## (کاری ئیسلامیی) و (بەهێز و پێزترکردنی کاری ئیسلامیی) و (فراوانترکردنی کاری ئیسلامیی)

# کاری ئیسلامیی

مەبەستمان لە (کاری ئیسلامیی) کۆی ئەو جم و جۆڵ و چالاکییانەیە کە ئامانج لێیان چەسپاندنی ئیسلامە لە عەقڵ و دڵی خۆمان و خەڵك و دەورووبەرمانداو، ڕەنگپێدانەوەی دینداریی و خوا پەرستییە لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی خۆمان و دەورووبەرماندا، دیارە ئەو جم و جۆڵ و چالاکییەش لە چەند موفرەدەیەك پێکهاتوە: پێش هەمووشتێك بانگەوازکردنی خەڵك، ئنجا فەرمان بە پەسندکردن و ڕێگریی کردن لە ناپەسند و، هەوڵدان بۆ چەسپاندنی دادگەریی و، لابردنی ستەم و خراپە، هەڵبەتە چەسپاندنی پەسندەکان و، لابردنی ناپەسندو خراپەکان لە هەموو بوارو لایەنەکانداو، پاشان کۆتا وێستگەو کۆتا بڕگەی کارو چالاکی ئیسلامیی ئەوەیە کە گۆڕانکاریی بەسەر سیاسەت و ئابووریی و لایەنە کۆمەڵایەتیی و، پەیوەندییەکانی کۆمەڵگاکەماندا بهێنین، ئەمە دوا وێستگەیە، بەڵام لە ڕاستییدا هەموو ئەو شتانە کە ئەنجام دەدرێن، بەمەبەستی خوا لە خۆ ڕازی کردن و، سوود بە خەڵك گەیاندن و، خەڵك بەهرەمەند کردنن، لە ئیمان و ئیسلام، ئەمانە هەموویان دەچنەوە ژێر ناوونیشان و پێناسەی کاری ئیسلامیی، کەواتە: با ئێمە وریا بین و بزانین! کە کاری

ئیسلامیی دەیەوێ گۆڕانکاریی لە سیاسەت و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سەرخانی کۆمەڵگاشدا بکات، بەڵام بێگومان بەر لەوە، دەیەوێت گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی بکات لە ژێرخانی کۆمەڵگادا، کە بریتیە لە گۆڕین و ڕاستکردنەوەو چاککردنی بووناسیی و تێڕوانینی خەڵك، ئینجا ئیمان و عەقیدەیان، پاشان ڕاستکردنەوەی خواپەرستییان، ئەگەر کەموکوڕیی و بیدعەتی تێدا هەبێت، پاشان ڕەوشت و ئاکاریان و، تێدا پەیدا کردنی تەقواو تەزکیەیان، ئەمانە هەموویان دەچنەوە نێو چوارچێوەو پێناسەی کاری ئیسلامیی، بۆیە ئێمە کاتێك دەبینین دوا وێستگەی کاری ئیسلامییمان لێ دوورە، کە بریتییە لەوەی گۆڕانکاریی بکەین لەسەرخانی کۆمەڵگادا واتە: جڵەوی کاروباری وڵات بە دەست ئێمەوە بێت، لە ڕووی سیاسیی و ئیداریی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، نابێت خۆمان بە دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆ بزانین، چونکە وەك پێشتریش زۆرجار گوتوومانە: زۆرێك لە پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" بۆیان نەکراوەو بۆیان نە لواوە، کە گۆڕانکاریی بکەن لەسەرخانی کۆمەڵگاداو، لە ڕووی سیاسیی و ئیداریی و ئابوورییەوە کۆمەڵگا بگۆڕن، هەر ئەوەندەیان پێکراوە بەرنامەیەك کە خوا پێیدا ناردوون، وەك پەیامی خوا بیگەیەنن و، هەوڵبدەن خوا بەیەکگرتن (توحید الله) لە دڵ و عەقڵی خەڵکدا بچەسپێنن و، لە ڕووی ڕەوشتیی و ئاکاریی و لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە،

كۆمەڵگایەكەیان بگۆڕن و ، پاكسازیی و چاكسازیی تێدا بكەن، بەڵكو جاری وایە ئەوەندەشیان بەتەواویی بۆ نەكراوە، زۆر لە پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" هەر لەسەر ئەوە كە بەخەڵكیان گوتوە: واز لە بت پەرستیی و خراپەكاریی بێنن و، واز لە ڕەفتارو نەریتی نەفامیی بێنن و، واز لە ڕەوشتی دزێو و پەست بێنن، هەر لەسەر ئەوەندەش جێگایان نەبۆتەوە لە شارو وڵات و ئاوەدانیی خۆیاندا شار بەدەر كراون و، خوای پەروەردگاریش سزای گەلە كافرەكانیانی داوە.

ئنجا بێگومان ئیسلام دوا نوسخەی هیدایەتی خوا بۆ مرۆڤ و، كۆتا پەیام و بەرنامەی بۆ بەشەر، گشتگیرو فرە ڕەهەندە و بۆ پاك و چاككردن و، ڕێكخستنی سەرلەبەری ژیان و گوزەرانی خەڵك هاتوە، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، بەڵام پێویستە مسوڵمانانی هەر كۆمەڵگایەك زۆر وردبینانە سەرنجی كۆمەڵگای خۆیان بدەن و، چ شتێك بۆیان پێویستترو لە پێشترە لەوەوە دەست پێبكەن و، زیاتر بایەخ بەوە بدەن و هیچ گومانیشی تێدانیە، كە تێڕوانین و بیروڕاو خولیایەكانی خەڵك و كۆمەڵگەایەك و ڕەوشت و ئاكارەكانی، بە ژێرخان (أساس البناء) دادەنرێن و، حوكم و سیاسەت و ئیدارەو ئابووریی و...هتدیشی بە سەرخانی دادەنرێن، ئنجا خواش فەرموویەتی:

﴿...إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ... ١١﴾ الرعد.

واتە: خوا واقیعی هیچ کۆمەڵگایەك ناگۆڕێ تاکو ئەوان دەروونی خۆیان نەگۆڕن.

## بەهێزو پێزتر کردنی کاری ئیسلامیی

بە دڵنیاییەوە ئەم کارو چالاکیی و جم و جۆڵە ئیسلامییەی ئێمە، هێزو پێزەکەی لەوەدایە کە بە واتای وشە ئیسلامیی بێ و، لە چوارچێوەی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا بێ و، بەو شێوەیە بێت کەلە لای خوای بەرزو مەزن پەسندە، چونکە ئێمە دەبێ بە پێی شەریعەتی خوا بەندایەتیی بۆ خوا بکەین، نەك بە پێی سروشت (طبيعة)ی خۆمان، هەروەها بە پێی تەرازوو (میزان)ی شەریعەت بەندایەتیی بۆ خوا بکەین، نەك بەپێی حەزو میزاجی خۆمان، هێزو پێزی کارو چالاکیی ئیسلامییش لەوەدایە کە نێوەڕۆکێکی ئیسلامیی هەبێ، هەروەها فۆڕم و ڕواڵەتێکی ئیسلامییشی هەبێت و، دیسان چۆنیەتییەکی شەرعییانەو ڕێك و ڕاستیشی هەبێت.

## فراوانتر كردنی كاری ئیسلامیی

مەبەستمان پێی ئەوەیە كە كاری ئیسلامیی قەتیس نەبێت لە خەڵكێكی دیارییكراو و كەسانێكی سنووردواردا، بەڵكو گەشە بكاو لە فراوان بووندا بێ و، توانای وەخۆگرتنی خەڵكی زیاتری هەبێت، كە ئەوەش وەك دواتر باسی دەكەین دەگەڕێتەوە بۆ جۆرو چۆنیەتی تێگەیشتن و پێگەیشتنی خۆمان، بەڵێ مەبەستمان لە فروانتركردنی كاری ئیسلامیی ئەوەیە كە چوارچێوەو بازنەكەی فراونتر بێ و باوەشەكەی فەڕاحتر بێ و، جێی خەڵكی زیاتری تێدا ببێتەوەو، متمانە و ئومێدەواریی زۆریشی هەبێت بەخەڵك و لێیان نائومێد نەبێت و، پێی وانەبێ كە ئەوەندەی كراوە، توانا هەر ئەوەندەیەو هیچی دیكە ناگونجێ بكرێ، ئنجا ئەگەر بشویسترێت كارە ئیسلامییەكەمان بەهێزو پێزتر بێ و، چوارچێوەو بازنەكەی فراوانتر بێت، دەبێ هەمیشە سەرگەرمی چاوپێداگێڕانەوەی و هەڵسەنگاندنی بین، خەریكی ڕەخنە لێگرتنی بین، چونكە كارێك كە مرۆڤ دەیكات، بێگومان كەموكوڕیی هەر هەن، دەشگونجێ هۆكاری كەموكوڕییەكان زۆربەیان یان بەشێكیان لە دەرەوەی ئەو كارو چالاكییە ئیسلامییەمان بن، دوژمنان و ناحەزان هەوڵ بدەن قەتیسی بكەن و لە قاڵبی بدەن، بەڵام

ئەوەندەی كە پەیوەندیی بە خۆمانەوە هەیە، دەبێ هەوڵبدەین كۆسپ و لەمپەرەكان لابەرین و، هۆكارەكارەكانی نەهێشتنی گەشەكردن و بەرەوپێشچوونی نەهێڵین، ئنجا ئەوكاتە ئەوەی بە دەست خۆمان نیەو بەدەستمانەوە نایەت و، كاری ناحەزانەو كۆسپ و لەمپەر دروست دەكەن، ئێمە پێی ئەركدار (مُكلَّف) نەكراوین، بەڵام بێگومان ئەوە بەدەست خۆمانە، كە بۆخۆمان كارە ئیسلامییەكەمان بچووك نەكەینەوەو تەقزیمی نەكەین و قۆرخی نەكەین لەسەر كۆمەڵێكی دیارییكراو و، دەرگا بە ڕووی خەڵكدا دانەخەین و، كارە ئیسلامییەكەمان چ لە ڕووی نێوەڕۆكەوە، چ لە ڕووی ناوەوە، چ لە ڕووی ڕواڵەت و فۆڕم و شێوازی كاركردنییەوە، وا لێ نەكەین، كە ڕێ لەخەڵك بگرێ: نەتوانێت لێی نزیك بكەوێتەوە.




# ئێمە خۆمان چۆن بین،
# کارەکەشمان ئاوا دەبێت

**بەرِێـــــزان!**

هەمیشە كردەوەكانی هەر كەسێك و هەڵسوكەوتەكانی و، رِەوشت و ئاكارەكانی و هەڵوێستەكانی زادەی كەسایەتیی ئەو كەسەن، مرۆڤ چۆن بێ، كردەوەكانیشی ئاوا دەبن، بۆیە ئەگەر بمانەوێ كارە ئیسلامییەكەمان بە هێزو پێزتر بێ و فراوانتر بێ، گەشەسەندووتر بێ و، خەڵك پێی ئومیدەوارتربێ و، ئەویش ئومێد بەخشتر بێ و، زیاتر جێی متمانەو باوەرِو دڵ پێخۆش بوونی خەڵك بێت، ئەوە دەبێ لە خۆ گۆرِینمان و دەستكارییكردنی خۆمانەوە، دەست پێ بكەین، بۆچی؟ چونكە ئاشكرایە دواجار كارە ئیسلامییەكەی ئێمەو جموجۆڵ و چالاكییەكانی ئێمە، هەڵقوڵاوی كەسایەتیی ئێمەن، كوردەوارییی خۆمان دەڵێن: (گۆزە چی تێدا بێ ئەوەی لێ دەرِژێ)، عەرِەبیش دەڵێن: (وكل إناء بالذي فيه ينضح) كەواتە: ئێمە خۆمان چۆن بین كارەكەشمان وا دەبێ، بۆیە لێرەوە دڵسۆزانە بە هەموولایەك دەڵێم و، هەرچی بە ئێوەشی دەڵێم پێشی بە خۆمم گوتوەو هەوڵیشمداوە، وا بكەم خوا پشتیوان بێ: با هەوڵبدین هیچ شتێك بە خەڵك نەڵێین كە پێشتر خۆمان نەمانكردبێت و، رِێنمایی خەڵك نەكەین بۆ هیچ شتێك كە پێشتر لە خۆماندا بەرجەستەمان نەكردبێ، زانایانی پێشینمان رِەحمەتی خوایان لێبێت هەیان بووە پرسیارێكی لێكراوە، یاخود داوای رِێنماییەكی لێكراوە، كەچی بێ دەنگ بووە، دوایی

لێیان پرسیوە بۆچی بێ دەنگ بووی؟ گوتوویەتی دڵنیا نەبووم کە ئەوەم بۆ خۆم کردبێت، گوتم نەوەك شتێك بڵێم نەمکردبێ و، وەبەر حوکمی ئەو ئایەتە بکەوم کە دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣﴾ الصف،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆچی قسەیەك دەکەن کە کارتان پێ نەکردوە، گەورەترین گوناحە لە لای خوا، قسەیەك بکەن کارتان پێ نەکردبێ!.

بەڵێ ئەگەر بمانەوێ وتارمان، کردارمان، هەڵوێستمان، هێزو پێزو بڕشتی هەبێ، کاریگەریی هەبێ، دەبێ قسەکە پێش ئەوەی بەخەڵکی بڵێین، لە خۆماندا بەرجەستەمان کردبێت، کردەوەکە خۆمان جێ بەجێمان کردبێ، هەڵوێستەکە لە خۆمان دا ڕەنگیمان پێدابێتەوەو نمایانمان کردبێ، کە هەر ئەوەش واتای ڕاستییە، ڕاستیی (صدق) کە هەندێك کەس بە ڕاستگۆیی لێکی دەدەنەوە، بەڵام ڕاستگۆیی واتە: قسەی ڕاستکردن، بەڵام (صدق) ئەوە کە خوا دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾ التوبة،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بكەن و لەگەڵ ڕاستاندا بن.

ئنجا ڕاست (صادق) كەسێكە زمانی ڕاست بێ، ناخی ڕاست بێ، ڕواڵەتی ڕاست بێ، كردەوەی ڕاست بێ، لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خەڵك و لەگەڵ خوادا ڕاست بێ و، ئاشكراو پەنهانی ڕاست بێت.

**ئنجا بەڕێـــزان!**

خوا ئاگادارە، زۆرێك لەوانەی كە باسی ئیسلام بۆ خەڵك دەكەن، چ ئێمەومانان كە ناوێكی ئیسلامییمان لەسەرە، چ زۆر لەو ئامۆژگارییكارو وتاربێژانەی كە هەن، ئەگەر نەك هەرچی دەیلێین بۆ خۆیان كاری پێ بكەن و، چۆن بە خەڵك دەڵێن چاكە بكەن، بۆ خۆیان وابن، بەڵكو هەر نیوەی ئەوەش جێ بەجێ بكەن، دنیا زۆر دەگۆڕێ! بەڵام بەداخەوە - بە پێی زانیاریی من كە ورد دەبمەوە لە خەڵك، چونكە لەسەرمان پێویستە چاو بە واقیعەكەی خۆماندا بگێڕین و، چاو وردبكەینەوەو بپشكنین بزانین ئەو خەڵكە دۆخی چۆنە؟ - زۆرێك لەوانەی كە باسی ئیسلام دەكەن، كەم و كوڕیی و كرچ و كاڵیی زۆریان هەیە، تێكڕای لایەن و گرووپ و مەشڕەب و ڕێكخراو و دەزگا ئیسلامییەكان، كەسانی زۆریان تێدان كە دەردو

نەخۆشیی بێڕەزاو كوشندەیان هەن، ئێمە خەڵك بانگ دەكەین دەڵێین وەرن بۆ ئیسلام، ئیسلام چارەسەری هەموو دەردێكەو، هەتوانی هەموو برینێكەو، سارێژی هەموو زامێكەو، هەموو كەموكوڕییەك چارەسەر دەكات، ئنجا دەبێ خەڵك ئەوە لە خۆتدا ببینێ، زۆرجار گوتوومە: ئەگەر بمانەوێ عیبادەت فێری خەڵك بكەین، دەبێ عابید بین، بمانەوێ زوهد فێری خەڵك بكەین، دەبێ خۆمان زاهید بین، بمانەوێ زانست فێری خەڵك بكەین، دەبێ خۆمان ئەهلی زانست بین، بمانەوێ تەقوا فێری خەڵك بكەین، دەبێ ئەهلی تەقوا بین، هەروەها ئەگەر بمانەوێ دادگەریی فێری خەڵك بكەین، دەبێ خۆمان دادگەر بین، دیسان بمانەوێ ڕەحم و بەزەیی فێری خەڵك بكەین، دەبێ خۆمان بە ڕەحم بین بە بەزەیی بین، هەتا كۆتایی هەموو كار و خەسڵەتە باشەكان.

بۆیە دڵسۆزانە پێتان دەڵێم: با هەوڵبدەین نێوەڕۆكی خۆمان چاكتر بكەین، تاكو ئەو نێوەڕۆكەمان كە چاكترەو پاكترە، كاتێك قسە دەكەین، مامەڵە دەكەین لەگەڵ خەڵكدا، لەو نێوەڕۆكە چاكەمان بۆ خەڵك پێشان بدرێ و نمایش بكرێ، ئەگەرنا كەسێك لە خودی خۆیدا بۆنی ناخۆشی لێ بێ، هەرچەندە بانگەشەی ئەوە بكات كە: عەترێكی خۆشم لە خۆم داوە، بەڵام دواجار خەڵك بۆنی ناخۆشی لێ دەكەن، ناخەكەت

چۆن بێت، تازە هەر وای، ئنجا با وریا بین (دوور كوژی نزیك خەسار) نەبین، (ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران) نەبین، با وانەبین بە قسە خەڵك بۆ لای خوا بانگ بكەین، بەڵام بە كردەوەو هەڵوێست و زمانی حاڵ بیانسڵەمێنینەوە، لێرەدا دڵسۆزانە قسە دەكەم بۆ هەموو لایەك و، دەشزانم لەو بارەوە كەموكوڕییمان زۆرە و دەبێ چارەسەریان بكەین.

دووبارە دێمەوە سەر قسەكەم دەڵێم: خۆمان چۆن بین كارەكەشمان وا دەبێت و، كردەوەكانمان زادەی كەسایەتیی خۆمانن، بۆیە با هەوڵبدەین لە هەموو ڕوویێكەوە خۆمان زیاتر تێگەیشتووبین و پێگەیشتوو بین، ئنجا ئەوكاتە ئێمە و كارە كۆمەڵەكشمان وەك میوەیەك دەبین كە پێگەیشتبێ و بە تام بێ و پێویست ناكات پڕوپاگەندەی زۆری بۆ بكرێ، بۆیەش من زۆرجار كە ڕیكلام و بانگەشە دەبیستم سەبارەت بە جۆرەكانی خواردن و كەل و پەلەكان، دەڵێم: هەر شتێك زۆر بانگەشەی بۆ بكرێ ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ: چۆنیەتییەكەی باش نەبێت، شتی باش و نێوەڕۆك چاك، بانگەشەو ڕیكلامی ناوێ، كەسێك لە خودی خۆیدا ڕاست و ساغ و پاك و چاك بێ، پێویست ناكات خەڵك مەدحی بكات و پێی هەڵابڵێ و خۆی دیارە، كەسێكیش وا نەبێ، هەزار ساڵ مەدح و سەنا بكرێ، خەڵك دەزانێ كە پێهەڵاگوتەر (مدّاح)ە كە درۆ دەكات، چونكە: لە

پێهەڵاگوتراو (ممدوح)ەكە ورد دەبێتەوە وا نیە، وەك هەموو ئەو دیكتاتۆرانەی كە لە هەڵبژاردندا لە ٩٩٪ دەنگەكان دێنن، بەڵام دەبینین هەمووی درۆو دەلەسەیەو، دوایی كە خەڵك لێیان ڕادەپەڕێ، دەردەكەوێ: لە سەدا یەك (١٪)یان لەگەڵدا نەبووە، وەك هەموو ئەو دیكتاتۆرانەی لە ساڵانی رابردوودا ڕووخان و ئیدیكەش ماون، خوا پشتیوان بێت ئەوانیش دەڕووخێن و كۆتاییان پێ دێ، كەواتە با وریابین! خۆمان چۆن بین كارو جم و جۆڵ و چالاكییەكانیشمان وادەبن و لە خۆمان دەچن، چونكە كردەوە و ڕەفتاری هەر كەس و كۆمەڵێك سێبەر و ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوە (صدی)ی كەسایەتیی و، كت و مت هاوشێوە و فۆتۆكۆپییەتی!

**خوشك و برا سەنگینەكانم!**

بەر لە هەر شتێك مەبەستمان لە خودی خۆمان: جۆرو چۆنییەتی (بوونناسیی و تیڕوانین)مانە، ئێمە چۆن تەماشای ئەم بوون (وجود)ە دەكەین؟ چۆن تەماشای خۆمان دەكەین؟ چۆن تەماشای ژیانی دنیاو رۆژی دوایی دەكەین؟ چۆن تەماشای خوای بەرزو مەزن دەكەین؟ چۆن تەماشای گەردوون (كون) دەكەین؟!

پاشان مەبەستمان لە (خودی خۆمان) ئیمان و عەقیدەیە كە لەسەر ئەو بناغەی بونناسییە هەڵدەچنرێ، ئیمان بە خوای بێ وێنە، وەك: تاكە بەدیهێنەرو، تاكە خاوەن و، تاكە پەرستراو و، خاوەنی هەموو ئەو سیفەت و ناوە پەسندانەی كە هەر هی ئەون:

﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعراف

﴿...وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ... ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم،

ئەو پەروەردگارەی كە بەندەكانی خۆش دەوێن و بۆیان بە پەرۆشە، بۆیە ئەو هەموو پێغەمبەرانەی ناردوون (علیهم الصلاة والسلام) هەروەها ئەو هەموو كتێب و بەرنامانەی دابەزاندوون، تاكو مرۆڤەكان تووشی ڕۆژ ڕەشیی نەبن لە دنیاداو تووشی بێمرادیی نەبن لە دواڕۆژداو، تووشی سزاو ..زەبەی خوای

دادگەر نەبن و بەختەوەر بن، یەکەمجار ئیمان بەخوا، ئنجا ئیمان بە فریشتەکانی خواو، ئیمان بە کتێبەکانی خواو، ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) و، ئیمان بە ڕۆژی دوایی و، ئیمان بە قەدەر و ئەندازەگیریی و نەخشەدانانی خوای زاناو توانا.

پاشان مەبەستمان لە (خودی خۆمان) خواپەرستیی (عبادة) مانە، چونکە هەر کەموکوڕییەك لە خوا پەرستییدا هەبێت، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بناغەکەی کە بریتیە لە ئیمان.

لێتانی ناشارمەوەو پێویستە لەسەرم بە حوکمی پێگەکەم و بە حوکمی بەرپرسیارێتیی دینیی و دنیاییم، لە بەرانبەر براو خوشکانم لە کۆمەڵی ئیسلامیی و، جگە لە کۆمەڵی ئیسلامییش دا، بە ڕوونیی بتاندوێنم و ڕاشکاوانە هەندێك شتتان بۆ بخەمەڕوو: زۆرجار سەرنج دەدەم بزانم نوێژەکەتان چۆنە؟ هی وا هەیە ئەگەر لەگەڵ ئیمامدا نوێژ بکات، بە ناچاریی دەبێ بمێنێتەوە تاکو ئیمام سەر بەرز دەکاتەوە، خۆ ناکرێ پێش ئیمام سەر بەرز بکاتەوە! بەڵام دیقەتم داوە کە بە تەنێ نوێژ دەکات، سەری دەگاتە زەوی و ناگاتە زەوی بەرزی دەکاتەوە، دەچێتە ڕکووع، بە ئاستەم دەچەمێتەوەو یەکسەر بەرز دەبێتەوە، ئەوەش تەنیا لە ڕووی ڕواڵەتی نوێژەکانەوە، هەروەها بە قالب گرانیی و تەمبەڵیی جووڵەکانی نوێژ دەکات، سەلام دەداتەوە

بە ئاستەم مل بادەدات، ئنجا ئایا دەبێ بابای ئاوا، نوێژەکەی لە ڕووی نێوەڕۆکەوە چەند کەموکوڕیی هەبێت! چونکە بۆ زانیارییتان! مەگەر چۆن دەنا کرچ و کاڵیی و کەموکوڕیی لە نێوەڕۆکدا، ڕەنگ دەداتەوە بەسەر ڕواڵەتیشدا، جارێك (عبدالله ابن مسعود) سڵاوی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە و دوایی وەك ڕوونکردنەوە و پۆزش هێنانەوە فەرمووی: (إن في الصلاة لشُغلاً) واتە: بەدڵنیایی لە نوێژدا سەرقاڵیی و نەپەڕژانە سەر قسەو کاری دیکە، هەیە. هێندە خۆ خوراندن و جموجۆڵ کردن، یانی: نازانی لە خزمەت کێدا وەستاوی؟ هەیە لە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکدا دەوەستێ، هەموو لەشی دەبێتە گوێ و چاو و خۆی ناجووڵێنێ، هەر مووی لێ ناڵەخشێ و ناجووڵێت، کەواتە لە خزمەت خوادا چۆن دەبێ هێندە جموجۆڵ بکەی؟

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە یەکێك لە هاوەڵانی فەرموو، لە کاتێك دا لە نوێژەکەی دا قسەی کرد: (إنَّ هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس، إنما هي التسبيح و التكبير و ذكر الله)[1]، واتە: بێگومان ئەم نوێژە هیچ شتێك لە قسەی خەڵکی تێیدا گونجاو و باش نیە، بەڵکو تەنیا بریتیە لە پاکگرتن و بە گەورەگرتن و یادی خوا کردن.

---

(١) رواه مسلم: (٣٨٢/١)

هەروەها دەبێ ئاگاداری بەرهەم و شوێنەواری خواپەرستیی بین، كە بەڵگەو نیشانەی ڕاستیی و ساغیی و قبووڵكرانیەتی، ئنجا نوێژە، ڕۆژوویە، زیكرە، پاڕانەوەیە، هەڵبەتە ڕواڵەتی نوێژەكە دەبینرێ بەڵام ڕۆژوو نابینرێت، ڕۆژوو مەگەر ئەوە ببینی، ئایا ئەو مرۆڤەی لەوكاتەدا كە بەڕۆژوویە، خۆی دەپارێزێ و زێدە پارێزییەك دەكات، كە هەمیشە مرۆڤ دەبێ هەر خۆی بپارێزێ، لەوەی زمانی لە خراپە بگەڕێ، بەڵام كە بەڕۆژوو دەبێت، پێویستە زیاتر خۆی بپارێزێت، هەروەها سەرجەم پەرستنەكانی دیكە، بۆ نموونە: تەقوا پەنهانەو لە دڵ و دەروونی مرۆڤدایە، بەڵام دوایی تەماشای ئەو شوێنەوارانە دەكەی كە لە تەقوا پەیدا دەبن، بەوەوە بۆت دەردەكەوێ، داخۆ ئەو كەسە تا چ ڕاددەیەك ڕاست دەكات، كە باسی دینداریی و تەقواو خواپەرستیی بۆ خەڵك دەكات.

ڕەنگە یەكێك لێرەدا بڵێ: من باسی خواپەرستیی و تەقوام بۆ خەڵك نەكردوە، تاكو گرفت و ئیشكالی ڕاست نەكردنم بۆ دروست ببێ!

دەڵێین: ئەدی باشە كارەكەمان چییە؟ بێگومان كارە ئیسلامییەكەی ئێمە ئەوەیە كە خەڵك دیندار بكەین، خەڵك خوا پەرست بكەین، خەڵك ڕەوشت جوان بكەین، خەڵك بۆ خوا سوڵحاو بكەین، ئنجا كە تۆ تاكو ئێستا باسی ئەوەت بۆ خەڵك

نەکردبێ، ئەدی چیت کردوە؟ ئنجا مرۆڤ بۆ خۆی چۆن بێ ئاواش قسە دەکات، واتە چ شتێك زۆر جێگای بایەخت بێت، باسی ئەوەش دەکەی، ئنجا ئەگەر تاکو ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان باسی گرنگیی نوێژت بۆ خەڵك نەکردبێ و، باسی گرنگیی تاعەت و خواپەرستیی و تەزکیەو تەقوات نەکردبێ، مانای لە خودی خۆتدا، لەوبارەوە کەموکوڕییت هەیە، هەوڵبدە کەموکوڕییەکەت چاك بکەی، ئەوجا باسی بکە، چونکە دەبێ گوزارشت بکەی لە واقیعی خۆت، ئەگەرنا وەبەر ئایەتەکە دەکەوی کە دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾﴾ الصف.

هەروەها لە ڕووی تەزکیەو تەقواوە، زۆرجار کە ڕادەمێنم و ورد دەمبەوە دەزانم: زۆر لە گرفت و کێشەکانی حیزب و ئۆرگانەکان دەگەڕێنەوە بۆ خەسڵەتە خراپە دەروونییەکان، بۆ وێنە یەکێك هەر لە خۆیەوە هەستیارە بەرامبەر هەموو شتێك، وەك مۆبایل بەردەوام لە خۆی دڕدۆنگەو هەمیشە لەسەر هەززەیە، هەر قسەیەك بکرێ، دەڵێ ئەوە مەبەستی من بوو، هەمیشە لە دڵەڕاوکەدا دایە، هەمیشە گومانی خراپە، هەمیشە سەرنجی قسەی خەڵکی دەداو دەڵێ: ڕەنگە مەبەستیان پێی من بێ، کە بە دڵنیایی ئەو هەموو گومانداریی و گوێداریی و، ئەو هەموو لە خۆ بە گومان بوون و، دڕدۆنگ بوونە لە خەڵك، زۆر خراپە.

یان هەیە كارێك دەكات پێی خۆشە خەڵكی دنیا هەمووی پێی بزانیّ! بۆیە ئامۆژگاریی بیّ لێتان برایان، خوشكان! كارێك بۆ خوا بیكەی، دەربەست نی داخۆ خەڵك دەزانیّ یان نا؟ مەگەر بۆیە پێت خۆش بێت، خەڵك چاو لە تۆ بكات، تاكو لە كارە چاكەكەی ئەوانیش دا، پاداشتت هەبێت، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە بە پێزە كە دەفەرمویّ:

﴿ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ٨ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ٩ ﴾ الإنسان،

واتە: خواردن دەدەن بە نەدارو هەتیو و دیل و (لە دڵی خۆشیاندا) دەڵێن، لەبەر ڕووی خوا، لەبەر ڕەزامەندیی خوا خواردنتان پیّ دەدەین، نە پاداشتمان لێتان دەویّ نە سوپاس، (جزاء) پاداشتی كردەییە، (شكور) سوپاسكردنی بە زارە، واتە: نە پاداشتی مادییمان لێتان دەویّ، نە سوپاسكردنی مەعنەویی، لەبەرچی؟ چونكە بۆ خوامان كردوە، بە ئەندازەی ئەوە كە كارەكان بۆ خوا دەكرێن، چاوەڕوانیی لە بەندەكان ناكریّ، دەجا خوا ئاگادارە كەسی وام پیّ شك دیّ، لە ئاستی سەركردایەتیی و خوار سەركردایەتییش و لە هەموو ئاستەكانداو، لە برایان و خوشكان، كاتێك چالاكییەك ئەنجام دەدات، دڵسۆزییەك دەنوێنیّ و كارێك دەكات، ئەگەر بزانیّ خەڵك پێی نەزانیوە، خۆی زۆر پیّ ماڵوێرانەو پێی وایە ڕەنج بە خەسارە، دەڵیّ:

من ئەو كارەم كردو كەسیش پێی نەزانی، یان كەس سوپاس و دەستخۆشیی لێ نەكردم! بەڕێزگیان! ئەگەر بۆ خوات كردوە، خوا بۆی نووسیوی و پاداشتیشت دەداتەوە، بەڵام ئەگەر هێندە سووربی خەڵك پێی بزانێ، دیارە بۆ خوات نەكردوە، چونكە ئەگەر بۆ خوا بیكەی، دەربەست نی، خەڵك پێی دەزانێ یان پێی نازانێ، یان جاری واهەیە وەفدێك دەچێ بۆ لای لایەنێك، هەیە دەچێ لە شوێنێك دادەنیشێ كە هی ئەو نیە، لە جیاتی ئەوەی تۆزێك ڕەچاوی ئەوە بكات كێ لەو بەتەمەنترە، یان لە ڕووی حزبییەوە، لە ڕووی زانست و زانیارییەوە، لە ڕووی هەر شتێكەوە لە پێشترە، مرۆڤ دەبێ لە خوارتر دابنیشێت و بیبەنە سەرێ، نەك بچێتە سەرێ و دوایی بیهێننە خوارێ، یان خۆزگە بخوازن هاتبایە خوارێ، چونكە جاری واهەیە ناگونجێ بیهێننە خوارێ، بەڵام خەڵك دەزانن ئەوە شوێنی وی نیە!

هۆكاری ئەو شتانەش هەموویان خەسڵەتە پەستە دەروونییەكان (الرذائل النفسية)ن، بۆیە ئامۆژگاریی خۆم دەكەم ئنجا هی ئێوە، كە لە خۆمان وریا بین و خۆمان پاك و چاك بكەین لە ناخەوە، چونكە هەرچی گوناح و ڕەوشت و ڕەفتاری خراپە، ڕیشەو بنكەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەزیلەیەكی نەفسیی، بۆ وێنە كەسێك فەخرو شانازیی بەسەر خەڵكدا دەكات، هۆیەكەی ئەوەیە كە لە

دەروونی خۆیدا خۆی پێ لەخەڵك زیاترەو خۆبەزڵگرییی (تكبّر)ی هەیە، یان كەسێك قسەیەكی حەقی بۆ دەكەی، پێی توورە دەبێ، ئامۆژگاریی دەكەی قەڵس دەبێت و، ڕەخنەی لێ دەگیرێ، پێی لالووت دەبێ، لەبەر ئەوەی لە دەروونییدا خۆ بەزڵگرییی و خۆ پەسندیی (عُجب)ی هەیە، هی وایە گوێ لە خەڵك ناگرێ و پێشنیاری خەڵك وەرناگرێ و، پێی وایە لە سەرووی ئەوەیە گوێ لە خەڵكی بگرێ و، پێشنیاریان وەربگرێ و، سەرسامە بە خۆی، بەڵێ هەموو ڕەوشت و ڕەفتارە خراپە دیارەكان، بنج و ریشەیەكی نادیاریان هەیە، كەسێك كە باسی ئەم و ئەو دەكات، لەبەر ئەوەیە لە دڵدا دەیانبوغزێنێت، بۆیە غەیبەتیان دەكات، كەسێك كە بەكەم تەماشای كەسێك دەكاو، بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵ دەكات، بەكەم تەماشاكردنی تێدایە، لەبەر ئەوەیە لە دەروونیدا خۆپەسندو خۆ بە زلگرە، هەورەها هەر ڕەوشت و ڕەفتارێكی دزێو و بەرچاوتان لە كەسێكدا بینی، بزانن ڕیشەو بنكێكی مەعنەوییی هەیەو، هەمیشە ڕیشەو بنكە مەعنەوییەكانی گوناحەكان، خراپترن لە دەرهاویشتەو ڕواڵەتەكانیان، تەماشا بكەن خوا بمانپارێزێت، ئیبلیس كە كڕنووش (كڕنوونشی ڕێزگرتن) بۆ ئادەم نابات، واتە سلاَوی لێ ناكات، دەڵێت چی؟ دەڵێ (أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ) من لەو باشترم خۆی پێ لەو چاكتر بووە لە دەروونی خۆیداو، ئەوەی نێو دەروونی بووە، وای لێ كردوە بە ڕواڵەت فەرمانی خوا جێ بەجێ نەكات یان دەڵێ:

﴿قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ... ﴿٦٢﴾﴾ الإسراء،

واتە: ئا ئەوەت دیوە بەسەر مندا بەرزت كردوە!! ئادەمی پێ كەمتربووە لە خۆی، ئنجا خۆی بە چی هەڵكێشاوە؟

﴿...خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف،

واتە: منت لە ئاگر دروستكردوەو ئەوت لە قوڕێ دروستكردوە، خۆی بە شتێكەوە هەڵكێشاوە كە دەستی تێدا نەبووە، كە بریتیە لەوەی خوای پەروەردگار بەو شێوەیە خوڵقاندوویەتی و لەو ماددەیە خوڵقاندوویەتی.

هەروەها با لە ڕووی ڕەوشت و ئاكارەوەو لە ڕووی ئەدەب و هەڵس و كەوتەكانەوە، لە نێوخۆمانداو، لەگەڵ ماڵ و خێزانداو، لەگەڵ دەرو دراوسێداو، لەگەڵ خزم و دۆستدا، بژاركراوبین لە خەسڵەتە پیس و بەدەكان و، ڕازاوە بین بە ئاكارو سیفەتە بەرزو پەسندەكان، بیستوومە هی وا هەیە ناچێ بۆ لای دەرودراوسێ یان ناچێ بۆ لای خزمان، یان تێكەڵیی لەگەڵ خەڵكدا ناكات و، لە شین و شاییاندا بەشدار نابێ، بەڵام مسوڵمان دەبێ ئاردی گەنم بێ لەگەڵ دەرودراوسێ و خزم و دۆستدا، بەپێی توانای خۆی لە بواری پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكاندا لەش سووك و ڕوو خۆش و قسە خۆش و زمان شیرین بێت.




# سێ بنەمای گرنگ
# لە بواری نێوخۆییدا

**خوشك و برا بەڕێزەكانم!**

لە سێ بڕگەدا سێ بنەمای گرنگ لەم تەوەرەدا دەخەینەڕوو:

## بڕگەی یەكەم:

## بەرجەستەكردنی دینداریی و مسوڵمانەتیی و پاراستنی شوناسی ئیسلامییمان

پێویستە زۆرباش لە نێوخۆماندا دینداریی و مسوڵمانەتیی بەرجەستە بكەین و، دروشمەكانی خوا پەرستیی زۆر گرنگیی پێ بدەین، وەك نوێژی هەینی و نوێژی بە كۆمەڵ و بەرپاكردنی سەرجەم دروشمەكانی دیكەی دینداریی‌یمان و، بەجۆرێك هەر كەس تەماشای ئێمەی كرد، بزانێ كە ئێمە خەڵكێكین پابەندین بە ئیسلامەوەو، سیماو نیشانەكانی مسوڵمانەتییمان پێوە دیار بن، هی خوشكانمان ئەوە دیارە هەمیشە سەرپۆشیان هەیە و پۆشاكی شەرعییان لەبەردایە[١].

---

(١) پۆشاكی ئافرەت زۆربەی خەڵك بە هەڵە پێی دەڵێن: (حجاب)، (حجاب)یش پەردەیە، پەردە (حجاب) ئەو پەردەیە كە دەیگرنەوە لەماڵەوە و وشەی (حجاب) لە قورئاندا بەو واتایە هاتوە: (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ) الأحزاب: ٥٣، واتە: هەر كاتێكیش

بەڵام دەبێ برایانیشمان وریابن، مادام هۆکارێك نەبێ پێویست بکات، سەروسیمای خۆیان بگۆڕن، بۆ نموونە: کەسێك نەخۆشیی پێستی هەیە، یاخود هۆکاریکی کۆمەڵایەتیی، یان هۆکارێکی ئەمنیی، جگە لەو حاڵەتانە، وا باشە سیمای مسوڵمانەتییان پێوە دیار بێت، وەك چۆن خوشکان سیمای مسوڵمانەتییان لە دوورەوە دیارە، براکانیش پێویستە سیمای مسوڵمانەتییان پێوە دیار بێت، هەڵبەتە من ڕیش هێشتنەوە بە فەرز نازانم و زۆر بە قورسم نەگرتوە[1]، بەڵام پیاوی مسوڵمان دەبێ سیمای تایبەتی خۆی بپارێزێ، ئنجا بەرسمێڵ کردنە، یان هێشتنەوەی ڕیشە، هەر شتێکی دیکەیە، هەڵبەتە لەو بارەوەو لە هەر ڕوویێکی دیکەشەوە، مسوڵمانان دەبێ وریابن و پارێزگاریی لە نێوەڕۆك و ڕواڵەت و دەروون و دەری

---

کەل و پەلێکتان لێیان (لەهاوسەرانی پێغەمبەر) خواست، لەپشت پەردەوە لێیان بخوازن، کە دەڵێن: ئەوە ئافرەتێکی موحەجەبەیە (محجّبة) یانی لەو دیو پەردەوەیە و خراوەتە پشت پەردە و پەردە پۆش کراوە، ئەوی دیکە دەبێ بگوترێ: پۆشتە و بە عەرەبی (مُحتشِمة) یانی: پۆشتە و پەرداخ.

(١) بەباشی دەزانم بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر مەسەلەی ڕیش هێشتنەوە، سەرنجی ئەو کورتە باسە بدرێ کە لە کتێبی: (پێشمەرگەی ئیسلام) دا هێناومە: (کورتە باسێك دەربارەی چۆنیەتی ڕیش هێشتنەوە و سمێڵ کورتکردنەوە) لاپەڕە ٩٦ - ١١٢ چاپی ٢٠٢٠/٤ ز.

کەسایەتیی ئیسلامیی خۆیان بکەن، بەڵام بە هاوسەنگیی وەك شەریعەت دایناوەو، دوور لە کورتهێنان و تێپەڕاندن.

بەڵێ مسوڵمان با هەوڵ بدات ڕێك و پێك و جوان و بۆن خۆش و پاك خاوێن بێ، بەڵام وریابێ تێنەپەڕێنێت لەسەر حیسابی گرنگییدان بە ناخی، گرنگیی بە ڕواڵەت و جەستەی بدات.

## بڕگەی دووەم:

## پـــاراستنی دۆستایەتیی و یەكڕیزیی و، ساغیی و ســـــافیی و بێ گرێ و گـــۆڵیی و، دووریی لە هەستیاریی و گومانی خراپ و، خۆدوورگرتن لە قسەو ڕەفتاری زەق و ڕەق

هی واهەیە لەگەڵ غەیری خۆماندا گفت و لفتی شیرینەو بەڕێزو بە حورمەتە، بەڵام لەگەڵ هاوەڵە خوشك و براكانیدا وانیە، زۆرجار گوتوومە: هەركەسێك پێی خۆشە سەرەوەی خۆی لەگەڵی چۆن بێت، با لەگەڵ خوار خۆشیدا وابێت، هەیە كوێخایانە لەگەڵ خوارخۆیدا ڕەفتار دەكات! ئایا پێت خۆشە ئەوانی سەرەووت كوێخایەتییت بەسەردا بكەن؟ نەخێر، بەڵكو پێت خۆشە برایەتیی بێت، مادام وایە لەگەڵ خوار خۆشتدا وابە، هەیە لێی تێك دەچێت لەگەڵ سەرەوەی خۆی پێی خۆشە دیموكراسییانەو، بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ كە لە قالبی خۆش دێت، بەڵام لەگەڵ خوار خۆیدا لە بیری دەچێت و دەبێتەوە دیكتاتۆر، ئنجا ئەوە هەر لە بەرپرسی ئەنجوومەنێكەوە بگرە، تاكو ئەندامێكی سەركردایەتیی و ئەنجوومەنی سیاسیی و كەسی یەكەم، هەمووی دەگرێتەوە، مەبەستم پێی هەموو لایەكە، دەبێ خۆمان پێ لە براكانمان زیاتر نەبێ و، خۆمان

پێ لە خوشکەکانمان زیاتر نەبێت و، خۆمان پێ وەك ئەوان بێ، ئنجا ئەگەر ئەوان ڕێزێکی زیادەیان لێناین، خوا پاداشتیان بداتەوە، بەڵام بۆ خۆت نابێ ئیددیعات هەبێ، لەبەر ئەوەی تۆ سەرکردایەتیی، یان ئەنجوومەنی سیاسیی، یان چونکە بەرپرسی ئۆرگانەکەی، پێت وابێ تۆ لە هەموویان چاکتری، یان دەبێ هەموویان گوێت بۆ بگرن و هەموویان ڕێزت لێ بگرن، بەڵام تۆ عەفووی لەوەی ڕێزیان لێ بگری و گوێیان بۆ بگری!!

با پێکەوە یەکڕیزو ساغ و ساف، بێ گرێ و گۆڵ بین و، خۆمان بەدوور بگرین لە هەر شتێك کە دڵی یەکدی بریندار بکات و، با پێکەوە هەستیار نەبین و گومانی خراپمان نەبێ و، بەرانبەر یەکدی دڕدۆنگ نەبین.

## بڕگەی سێیەم:

## هەرچی زیاتر ڕەچاوكردنی وردەكاریی و كارامەیی و پێشكەوتوویی لە كاروبارەكانمانداو، پاراستنی دیسپلین (ضبط و ربط)ی حیزبیی و ڕێكارە ئیدارییەكان

مەبەستمان ئەوەیە نابێ كەس پێی وابێ لەبەرئەوەی دینداریی و مسوڵمانەتیی دەكەین، مانای وایە گوێ نەدەین بە وردەكاریی و كارامەیی و دەسترەنگینیی و ڕێك و پێكیی لە كارەكانماندا، مادام كارەكانمان بۆ خوان! بەڵكو مادام بۆ خوان دەبێ ڕێكترو چاكتر بین و، وردەكاریی زیاتریان تێدا بێ و بە ئامرازی پێشكەوتوترو، بە ڕێبازو شێوازی پێشكەوتووانەتر بن، تاكو ئیسلام لە ئەنجامی ئەوەدا وا نەیەتە بەرچاو كە دینێكی دواكەوتووە، بە هۆی دواكەوتوویەتی ڕێبازو ئامرازو شێوازە بە جێماوەكانی ئێمەوە، وەك كاتی خۆی تالیبان و هەندێك لە گرووپ و ڕێكخراوە ئیسلامییەكان كردیان، كە كتێبی: (الأحكام السلطانية)ی (الماوردي) و (أبو يعلى)یان كردبوون بە سەرچاوەی سیاسییان.

وشەو زاراوەکانی وەك: (وزارة التفويض و وزارة التنفيذ و والي و...الخ) یان بەکاردێنان، کە بێگومان ئەوانەی ئەو زاراوانەیان داناون، بە گوێرەی باوی سیاسیی ڕۆژگاری خۆیان بووەو ئەوکات هەموو دەوڵەتەکان بەو شێوەیە بەڕێوە چوونەو، ئەوانیش کارتێکراوبوون بە دەورووبەری خۆیان، بۆیە شتێکی نا لۆژیکییە لەم سەدەی پازدەیەمی کۆچیی و سەدەی بیست و یەکەمی زایینیدا، لە ڕووی دەوڵەتدارییەوە، تەقلیدی کتێبێك بکەین کە لە سەدەی پێنجی کۆچییدا نووسراوە، واتە: دەوری نۆ سەد (٩٠٠) ساڵ لەمەوبەر!

مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە نابێ لە مێژوودا بژین، بەداخەوە کەسی وا هەیە هەستیاریی هەیە بەرامبەر هەندێك زاراوەی تازە، کە نێوەڕۆکێکی خراپیشیان نیە، بەڵام نابێ هەستیارییمان بە زاراوە تازەکان هەبێ هەر لەبەر تازەییان، یان لەبەر ئەوەی خۆمان بەرهەممان نەهێناون، وەك چۆن هەستیارییمان نیە بە وشەکانی: کۆمپیوتەرو تەلەفزیۆن و، ڕۆکێت و ئۆتۆمبیل و فڕۆکەو...هتد، هەروەها هەر شتێکی تازەی دیکە لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیاو پیشەسازیی و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا، با هەستیارییمان بەرانبەریان نەبێ، مادام سوودبەخشن، کاتی خۆی چونکە دەوڵەتی ئیسلامیی بەهێزو پێز بووە، دەربەست نەبوون لە کوێوە شتی باش وەردەگرن،

لەسەردەمی ئەبوو بەكردا خوا لێی ڕازی بێت كە یەكەمین جێنشینی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)، لەسەردەمی عومەردا (خوا لێی ڕازی بێت) كە دووەم جێنیشینی پیغەمبەر بووە (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها لە سەردەمی عوسمان و عەلییدا (خوا لێیان ڕازی بێت)، زۆر بە دەستكراوەیی و بە دڵ فراوانیی هەرچی ڕێكخستنە ئیدارییەكانی دەوڵەتی فارس و رۆم هەبوون، هێنایانن و لێیان بەهرەمەند بوون، ئەگەرنا عەرەب پاشخانی سیاسیی و دەوڵەتدارییان نەبوو، هۆزو تیرەی پچڕ پچڕ بوون، زمانێكی یەكگرتووشیان نەبوو، بەڵام ئیسلام وای فێر كردبوون وەك ئایەتە بە پێزەكە دەفەرمویَ:

﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ١٨﴾ الزمر،

واتە: ئنجا موژدە بدە بە بەندەكانم، ئەوانەی گویَ بۆ هەموو قسەیەك هەڵدەخەن، ئنجا شوێن باشترینی دەكەون ئەوانەن كە خوا ڕاستەڕێی كردوون و هەر ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بە تایبەت لەسەردەمی عومەردا (خوا لێی ڕازی بێت) كە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (فَلَمْ

أَرَ عَبْقَرِيًّا يَفْرِي فِرْيَهُ)[1] واتە: هیچ بلیمەتێکم نەبینیوە وەك عومەر کاری باش بکات، عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) لەبەر ئەوەی ماوەی خیلافەتەکەشی دە (١٠) ساڵ زیاتر بوو، لە سەردەمی ئەودا دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر فراوانتر بوو، بەچی فراوانتر بوو؟ بەوە کە پێش سنووری دەوڵەتەکە عومەر عەقڵ و دڵەکەی فراوان بوو و ئیستیعابی ئەزموونی دەوڵەتانی دەوروبەرو گەلان و کۆمەڵگاکانی دەکرد، ئەوەی بە کەڵکی خۆیان دەهات هەمووی وەخۆ گرت و هەزمی کرد، بەڵام بە شێوەیەك کە ڕووحێکی ئیسلامیی بەبەردا کردەوە.

ئنجا ئێمەش پێویستە هەرچی زیاتر بگەڕێین بۆ ڕێبازی تازەو شێوازو ئامرازی تازەو چۆنییەتی تازە، هەر هۆکارێك و هەر ئامرازێك کە پەیدا دەبێت و زادەی فیکری مرۆڤە، با ئێمە بە موڵکی خۆمانی بزانین، چونکە دواجار فیکرو فەرهەنگ و زانست، موڵکی هەموو مرۆڤە، ئێستا کە زیاتر لە دەستی ئەوروپاییەکاندایە لە دەست ڕۆژ ئاواییەکاندایەو، خەریکە وردە وردە دەپەڕێتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئێستا یابانییەکان پێشکەوتووترن (لە هەندێك بەش و جۆری تەکنۆلۆجیادا) لە ئەمەریکاییەکان، چین خەریکە پێش ئەمەریکا دەکەوێتەوە، کاتی خۆی پێش ئەوانیش لە دەستی دەوڵەتی مسوڵماناندا

---

(١) أخرجه البخاري (٣٦٨٢) واللفظ له، ومسلم ٢٣٩٣.

بووە، پێش مسوڵمانانیش لە دەستی گریكەكاندا بووەو، لە دەستی هیندییەكاندا بووەو، لە دەستی دەوڵەتانی دیكەدا بووە كە لە دەڤەری میزۆپۆتامیادابوون، وەك ئەكەدییەكان و سۆمەرییەكان و ئاشوورییەكان و بابلییەكان و، پێشتر لە دەستی میسرییەكاندا بووە، واتە فیكرو فەرهەنگ و زانست و بەرەو پێشچوون و بەروپێشبردنی كۆمەڵگا، لە ڕاستییدا موڵكی هەموو بەشەرە، بۆیە با هەستیارییمان پێی نەبێ، بەڵام با ئاگامان لێبێ: وشەیەك، دەستەواژەیەك، یان ئامرازێك كە نێوەرۆكێكی خراپی هەیە، دەبێ دەستكاریی بكرێ، وەك خوای پەروەردگار كاتی خۆی بە مسوڵمانی فەرمووە:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا...﴿١٠٤﴾﴾ البقرة.

واتە: ئەی بڕوادارینە! مەڵێن: (راعنا) (لەبەر ئەوەی جوولەكەكان بەهرەی خراپیان لەو وشەیە وەردەگرت) بڵێن: (انظرنا).

كە (انظرنا)ش هەمان مانای هەیە، بەڵام ئەو بەهرە خراپەی لێ وەرناگیرێت، (راعنا) ئەوان مەبەستیان پێ ئەوەبوو ئەگەر كەسرەكەی درێژ بكەیەوە (راعینا) واتە: تۆ شوانی ئێمەی، دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیانگوت: (یا محمد راعنا) واتە ئەی موحەممەد! تۆ شوانی ئێمەی، یان مانای (أرعن)یان لێدەگرت یانی: نەفام، گرنگ ئەوەیە

ئەوان بۆ مەبەستێکی خراپیان بەکاردەهێنا، بۆیە خوای کارزان فەرمووی: ئەو وشەیە بەکارمەهێنن و جێگرەوە (بدیل)ی بۆ دانان[١].

ئێمەش دەبێ ئێستا هەر وا بکەین، هەر وشەو زاراوەیەك بزانین واتایەکی خراپ دەگەیەنێ، با بەکاری نەهێنین و زاراوەو وشەیەکی دیکەی جێگرەوەی بۆ بەکاربهێنین، بەڵام بێگومان ناشکرێ ئێمە هەستیارییمان بەرامبەر بە ڕۆژئاواو بەرامبەر بە کافرستان، وامان لێ بکات هەموو شتێکی ئەوان بە خراپ بزانین، نەخێر دەبێ پاك و پیس لەیەکدی جیابکەینەوە، وەك ئایەتەکە دەفەرموێ:

﴿...فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ...١٨﴾ الزمر.

موژدە بدە بە هەموو ئەو بەندانەم کە گوێ بە هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام دوایی شوێن چاکترینی دەکەون و باشترینەکەی تەبەننیی دەکەن...

---

(١) عن قتادة و الكلبي قالا: كانوا يقولون: راعِنا سَمعك، و كانت اليهود يأتون فيقولون مثل ذلك يستهزؤون، فنزلت.
بڕوانە الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١ ص ٥٥، أخرجه عبدالرزاق في تفسيره (٥٤/١/١) ومن طريق ابن جرير في (جامع البيان) (٣٧٤/١)، قلنا: و سنده ضعيف لأنه مرسل.

هەروەها لە ڕووی ڕێكارە حیزبییەكانەوەش، دەبێ تەماشا بكەین چ حیزبێك ئەمڕۆ لە هەر كوێیەكی دنیادا زۆر سەركەوتووەو پیشكەوتووە، پێویستە ئەزموونی لێ وەربگرین و سەیری ڕێكارە حیزبیی و دیسپلینەكانی بكەین و، تەماشای شێوازەكانی بكەین و لێی بەهرەمەند بین، پێشەوا (عومەر خوا لێی رازی بێت) وای كردوە، كاتی خۆی كە دیوانەكان و پۆستەو بەندیخانەی دانان و، شارەكانی بنایتنان و، كۆمەڵێك شتی ئیداریی كردن، كە لەسەردەمی عەرەباندا نەبوون، دەوڵەتی فارس و ڕۆم ئەو كارانەیان دەكردو، عومەر (خوا لێی رازی بێت) هەڵسا بەهرەی لێ وەرگرتن، لە پێش ئەویشدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) - وەك پێشتریش باسمان كردوە-، ئاشكراشە هەر شتێك بەرەو پێشبردنی كۆمەڵگاو كارەكان پەكیان لەسەری بكەوێ، واجب دەبێت، وەك بنچینەیەكی شەرعیی دەڵێ: (ما لايتم الواجب إلاّ به فهو واجب).

**بەڕێـــــزان!**

لە چوار بڕگەدا، چوار بنەمای سەرەکیی لەم تەوەرەدا دەخەینەڕوو:

## بڕگەی یەکەم:

## بـــا عەقڵ و دڵی خۆمـــان گەورە بکەین و، بـازنەی کارەکانمـــان فەڕاح بکەین و، بازنەی دامەزراوەکان و دامودەزگا حزبییەکانمان فراوان بکەین، تاکو توانای لە خۆ گرتنی خەڵکمان زیاتر هەبێت

لە کتێبی: (هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی)دا باسی ئەوەمان کردوە وەك پێشنیارێك، کە ئێمە ئەگەر دەستکاریی ناوونیشانمان بکەین، یان دەستکاریی هەر شتێك بکەین، مادام بەرژەوەندیی کاری ئیسلامیی و گۆڕانکاریی ڕۆژگار بیخوازێت و نێوەڕۆکەکەشی سەلامەت بێ و، ئەو گۆڕانکارییە ناو و فۆڕم و شێوەیە، لە خزمەت نێوەڕۆکدابێت، با ئاوی لێ نەخۆینەوە، ئنجا ئێستاش ئەو قسەیە دووبارە دەکەمەوە، پێشم وایە ئەگەر لە ڕووی جوگرافییەوە لێرە بەولاوەترەوە ببینین و، لە ڕووی کاتییەوە لە ئێستا بە دواوە ببینین، زیاتر قەناعەت و جورئەتمان دەبێ بۆ گۆڕانکاریی کردن لە خۆماندا، لە ناودا، لە نێوەڕۆکدا، لە

شێوەی كاردا، لە زۆر شتدا، بە مەرجێك لە ڕووی جوگرافییەوە لێرە زیاتر ببینین و، وانەزانین دنیا هەر ئێرەیە، بەڵكو ئەولاش ببینە، بۆ نموونە: بەغدا ببینەو بچۆ بەغداو وەرەوە، سەرنجت لەسەر هەندێك شت دەگۆڕێ، بڕۆ میسرو وڵاتانی عەرەبیی و وەرەوە، گۆڕانكاریی دیكەشت دەبێت، بچۆ بۆ ئەورووپاو بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو وەرەوە، چاو بە زۆر شتدا دەگێڕیەوە، لەبەرچی؟ نەك لەبەر ئەوەی لە خۆمان بە گومانین، بەڵكو لە سۆنگەی ئەوەوە كە دەزانی لە دنیاداو لەملاولاش چ باسە؟ خەڵكیش بەرانبەر بە تۆ چی دەڵێ؟ ئایا ئەگەر ناوێكت هەبێ، یان دروشم و ناو و نیشانێكت هەبێ، خەڵكی لێ بسڵەمێتەوە، مولزەم نی كە لایبەری، بۆ ئەوەی خەڵك لێت نەسڵەمێتەوە، یان خەڵك تەفسیرێكی هەڵەت بۆ نەكات؟! یان لە كاتێكدا ناوێكت لە كەسی یەكەم ناوە، یان ناوێكت لە حیزبەكەت ناوە، یان ناوێكت لە ئۆرگانێكت ناوە، كە مایەی سڵەمینەوەو هەڵە لێتێگەیشتنی خەڵك، یاخود تەفسیر كردنی هەڵەیانە، وا باشتر نیە ئەو ناوە لابەری؟ وەك خوای پەروەردگار وشەكەی پێ لابردن:

﴿...لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا ﴿١٠٤﴾﴾ البقرة،

واتە: ئەو وشەیە بەكارمەهێنەو ئەو وشەیە بەكاربێنە،، یانی: ئەو وشەیە مانای خراپ بە دەستەوە دەدات، بۆیە بەكاری مەهێنن و وشەیەكی دیكە بەكاربهێنن.

بەڵێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەرەوەماندا، ئەگەر بمانەوێ کاری ئیسلامییمان بە هێزو پێزترو فراوانتر بکەین، دەبێ لە عەقڵ و دڵی خۆمانەوە دەست پێ بکەین، پێویستە عەقڵمان گەورە بکەین و دڵمان فراوان بکەین و، باوەشی خۆمان فەراح بکەین و، سێبەری خۆمان بەرین بکەین، ئنجا بانگی خەڵکی بکەین، ئەگەرنا لە چوار دیواری ژوورێکی تەسکدا، یاخود لە ژێر سێبەرێکی کەمبەردا، جێی خەڵکی کەمی لە بن دەبێتەوەو، لە چوارچێوەی ناوێکدا کە بۆتە پێناسەی کۆمەڵێکی دیارییکراو و[1]، هەر جێی ئەو کۆمەڵە دیارییکراوەی لە بن دەبێتەوە، ئەگەر بتەوێ خەڵکێکی دی پێی ئومێدەوار بێ و، بێتە بن ئەو سێبەرە، دەبێ سێبەرەکە دەستکاریی بکەی.

ئنجا وەك زۆر جار گوتوومە: ئایا دەوڵەتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و دوای ئەویش دەوڵەتەکەی ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی، (خوا لێیان ڕازی بێت)، هەروەها دەوڵەتە شەش مانگییەکەی حەسەنی کوڕی عەلی، کە ئەوەندە دەکاتە ئەو سی (٣٠) ساڵەی خیلافەتی ڕاشیدە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (ستکون الخلافة بعدي ثلاثون سنة، ثم یکون

---

(١) با لە ئەسڵ دا واش نەبووبێ، بەڵام مادام واقیعەکە ئەو گۆڕانکارییەی پەیداکرد، دەبێ وریابی و لەو گۆڕانکارییەی ئاگا نەبی.

مُلكاً)[1]، دوایی لەسەر دەستی (معاویة بن أبي سفیان) بووەتە پادشایەتیی و حوكمڕانی میراتیی و بنەماڵەیی، ئنجا ئایا دەوڵەتەكەی پێغەمبەرو هی خەلیفە ڕاشیدەكانی، ناوی چی بووە؟ بێگومان ناوی دەوڵەتی ئیسلامیی و، دەوڵەتی نەبەویی و، دەوڵەتی خیلافەی ڕاشیدە نەبووە، بەڵكو دوایی مێژوو وای نووسیوە، ئەگەر نا دەوڵەتەكان هەر دەوڵەت و قەوارەیەكی سیاسیی بوون و هیچی دی، ئنجا با ئێمەش نێوەڕۆكێكی ئیسلامیی و شەرعیی و شەریعەتییمان هەبێ و با ناوی كەس و حیزب و ئۆرگانەكان بەو شێوەیە لێ بكەین، كە بەرژەوەندیی زیاتر دەهێنێتەدی و، خەڵك كەمتر بتوانێ بەهانەی پێ بگرێ و، لێی بسڵەمێتەوە.

---

(١) رواه الترمذي: **٢٢٢٦** وقال الترمذي في (موافقة الخبر الخبر) (١٤١/١) حسن، و صحَّحه الأباني في صحيح سنن الترمذي، و أحمد في المسند (٢/٩٦٩) و قال شعيب الأرناؤوط محقق المسند: سنده حسن رجاله ثقات، و أبو داود: ٤٦٤٦، و قال الألباني في صحيح سنن أبي داود: حسن صحيح

## بڕگەی دووەم:

## با لە مامەڵەمان لەگەڵ دەرەوەی خۆماندا، ڕازاوە بین بە دوو سیفەتی هەرە بەرز کە خوا پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) پێ وەسف کردوون، یەکەمیان (نصح) و دووەمیان (أمانة)

(نصح) واتە: بەتەنگەوە بوون و بەپەرۆشەوەبوون و دڵسۆز بوون و بەخەمەوە بوون، چونکە زانایان دەڵێن: (النصح هو إرادة الخير للمنصوح)، یان دەڵێن: (النصح أو النصيحة هو أن تفعل و تقول ما فيه صلاح المنصوح)[1] واتە: ئەوەیە کە تۆ شتێك بڵێی و بکەی کە بەرژەوەندیی ئەو کەسەی تێدایە کە (نصح)ەکەی ئاراستە دەکەی.

ئنجا ئێمەش با:

**یەکەم:** با لە کاری سیاسییمان و لە جم و جۆڵ و چالاکییەکانمان و لە پەیوەندییە سیاسییەکانمان و لە مامەڵەمان، لەگەڵ دەرەوەی خۆماندا، ڕازاوە بین بە پەرۆش و دڵسۆزیی و بەتەنگەوەبوون،

---

(١) النُّصُح: تحري فعل أو قول فيه صلاح صاحبه.
بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص ٨٠٨، راغب الأصفهاني.

کە یەکێك لە ڕێگاکانی بە تەنگەوەبوون و پەرۆشبوون، بریتیە لە هەبوونی ستراتیژو پڕۆژەی گشتگیر کە هەموو چینەکان بگرێتەوەو، داکۆکییکاری مافە ڕەوایەکانی خەڵك و جەماوەر بین بە گشتیی.

**دووەم:** با ڕازاوە بین بە (أمانة) واتە: پاکیی و دەستپاکیی و دووریی لە خیانەت و ناپاکیی، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وابوون و گوتوویانە:

﴿... وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ٦٨﴾ الأعراف،

﴿...إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ... ٣٤﴾ هود،

هەروەها پێغەمبەری خاتەمیش (صلى اللله علیه وسلم) لەگەڵ ئەو خەڵکە ملهوڕەی هۆزی قوڕەیش و بێ بڕوایەکان کە ئازاریان دەداو تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەست و هاوەڵانیان شەهید دەکرد، بەڵام هەر لەگەڵیاندا دڵسۆز بوو لەگەڵیاندا ئەمیندارو پاك چاك بوو، ئێمە ناتوانین جگە لە دڵسۆزیی و پاکیی و چاکییمان هەبێت، لە مامەڵەمان لەگەڵ غەیری خۆماندا.

## بڕگەی سێیەم:

## با وریا بین لە هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، لا نەدەین

ئنجا ئایا هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی پێغەمبەران چین؟

**یەکەم:** هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون بۆ چەسپاندنی تەنها خوا پەرستیی:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥﴾ الأنبياء،

واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان پێش تۆ نەناردوە (ئەی موحەممەد) مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە بەخەڵك ڕابگەیەنێ تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن و تەنیا من پەرستراوم.

هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) بۆ چەسپاندنی ئەو پایە بەرزو مەزنە هاتوون.

با ئێمەش لەوە وریابین و پێمان شەرم نەبێت لە هەر کۆڕو مەجلیسێکدا، باسی ئەوە بکەین کە دەبێ تەنها خوا پەرستراو بێت بە مانا فراوانی پەرستن، نەك بەتەنها ڕکووع و سەجدە بردن، بەڵکو ئەوپەڕی خۆشویستن دەبێ تەنیا بۆ

خوا بێ و، ئەوپەڕی سام و هەیبەت لیٚ کردن و، ئەوپەڕی پشت پیٚ بەستن و، ئەوپەڕی مل بۆ کەچکردن و، ئەوپەڕی بەبەرز گرتن و بە مەزن گرتن، دەبێ تەنیا بۆ خوا بن، پاشان دروشمەکان (شعائر) تەنها بۆ خوا ئەنجام بدریٚن، وەك ڕکووع و سەجدەو پاڕانەوەو تەواف و نەزرو قوربانیی، هەروەها بەرنامەکان (شرائع)یش دەبێ تەنیا لە خوا وەربگیریٚن: حەڵاڵ و حەڕام تەنها دەبێ لە خوا وەربگیریٚن، هەروەها ئەو بنەمایانەی کە کۆمەڵگایان پیٚ ڕیٚکدەخریٚن لە ڕووەکانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتیی، هەر دەبێ لە خوا وەربگیریٚن.

**دووەم:** پاشان پیٚغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون بۆ چەسپاندنی دادگەریی، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ...﴿٢٥﴾ ﴾ الحديد.

بۆیە ناگونجێ ئیٚمەش نەیکەینە ویردی سەر زمانمان، کە دەبێ دادگەریی بچەسپیٚ و بڵیٚین: دژی ستەمین، دژی بێ دادیین، دژی چینایەتیی قڕیی و پڕیین، ئەم دووانە: خوا بەیەکگرتن و دادگەریی (التوحيد و العدل) گرنگترین و گەورەترین دوو پایەی ئایین و هیٚڵە گشتییەکانی بەرنامەی پیٚغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) و لە ئایەتی: ژمارە

(٢٥) سوورەتی (الأنبیاء)دا، خوای تاك و پاك دەفەرمویٚ: هەموو پیٚغەمبەرانم ناردوون بۆ چەسپاندنی ئەوە کە تەنها خوا بپەرستریٚ، هەروەها لە ئایەتی: (٢٥)ی سوورەتی (الحدید) دا دەفەرمویٚ: هەموو پیٚغەمبەرانمان ناردوون، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەرِیٚوە بچن.

بەڵیٚ (توحید) و (عدل) دوو پایەو کۆڵەگەی هەرە گەورەی رِیٚبازی پیٚغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، ئنجا دیارە ئەگەر ئەهلی تەوحید بین، دەبیٚ دژی شیرك بین، چ شیرکی رِواڵەتیی، چ شیرکی پەنهان، شیرکی رِواڵەتیی ئەوەیە کە بە ئاشکرا هاوبەش بۆ خوا دابنریٚ و، شیرکی پەنهانیش ئەوەیە کە شتیٚك، کەسیٚك، حیزبیٚك، رژیٚمیٚك، هیٚندە بەبەرز بگیریٚ، بهیٚندریٚتە رِیزی خوا، ئەمەش هەر شیرکەو شیرکی گەورەشە، با خەڵکیش کەمتر هەستی پیٚ بکەن، بۆیەش دەڵیٚم شیرکی پەنهان.

ئنجا ئەگەر ئیٚمە دادگەر بووین ئەو دادگەرییەی کە هەموو پیٚغەمبەرانی بۆ ناردوون، تاکو بیچەسپیٚنن، دادگەریی لە رِووی سیاسیی، لەرِووی نەتەوەیی لە رِووی ئابووریی و لە رِووی کۆمەڵایەتییەوە، دەبیٚ دژی ستەم بین و، دژی قرِیی و پرِیی و چەوساندنەوەی چینایەتیی بین.

**سێیەم:** یەکێکی دیکە لە هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە دوارۆژ بە ئامانج بگرین و، ژیانی دنیا وەك خۆی ببینین، دوارۆژ، قیامەت ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ لە بیریان چووەتەوە، بۆیە خوا لە قورئاندا، هەمیشە بڕوا بە خواو بڕوا بە ڕۆژی دوایی، پێکەوە هێناون، ئنجا دەبێ ئێمە لە پەیوەندییمان لەگەڵ خەڵکدا، هەمیشە ئاگامان لەو ئەسڵ و بنچینەیە بێت، کە ئەم دنیایە جێی تاقیکردنەوەیەو هۆڵی تێدا تاقیکردنەوەیەو، دوارۆژ مەنزڵی تێدا نیشتەجێ بوونەو، ئێرە پردی بەسەردا ڕەت بوونە.

**چوارەم:** یەکی دیکە لە هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە کە ئێمە هاوسەنگیی بپارێزین لە نێوان دین و ژیندا، واتە وێڕای ئەوەی کە گرنگیی بە ژین دەدەین، بەڵام ئاگامان لە دینداریی‌شمان بێت و، لە نێوان دنیاداریی و دینداریدا هاوسەنگیی (إتزان) بپارێزین، وێڕای ئەوە کە دینداریی دەکەین، ئاگاشمان لە ژیان و گوزەرانی خۆمان و خەڵکی بێت و، پاشان لە ڕوویێکی دیکەشەوە: ئاگامان لە کاری حیزبیی و، ڕێکخراوەیی بێ و، ئاگامان لە خوا پەرستیی تایبەتیی و دینداریی خۆشمان بێ و، وا نەبین وەك مۆمێك کە دەسووتێ و بۆ خۆی قاڵ دەبێتەوەو دەورووبەرەکەی ڕۆشن دەکاتەوە، بەڵام بۆخۆی لە بەین دەچێ!

با ئێمە وا نەبین، چونکە هەر کەسێك بۆ خۆی خێر نەداتەوە، بۆ خەڵکیش خێر ناداتەوە، بۆیە ئامۆژگارییتان دەکەم: زۆر ئاگاتان لە پەیوەندیی نێوان خۆتان و خوا بێت، زۆر ئاگاتان لە عیبادەتی شەخسیی بێ، زۆر ئاگاتان لە نوێژی سوننەت و ڕۆژووی سوننەت و، لە زیکرو قورئان خوێندن و، لە بۆخوا سوڵحان و، لە خۆ وریا بوون لە گوناحان، بێ، ئەگەر ئەوەتان نەبێ، خێرێ نادەنەوە، ئەوانە، لە بەرامبەر ترس و تەماعدا دەدۆڕێن و، ئەوانە دەکەونە ژێر کاریگەریی دەورووبەری هەڵەو پەڵەی خۆیان و، ئەوانە لە بەرانبەر ئارەزوواندا تێدەشکێن: کە لە خودی خۆیاندا لاوازو بێ هێزن، لە ڕووی تەقواو تەزکیەو بۆ خوا سوڵحان و پەیوەندیی توندوتۆڵەوە، لەگەڵ خوای پەروەردگاردا.

خوای بەخشەر وامان لێ بکات لە پەیوەندیی لەگەڵ خۆیداو لە دڵ و دەروونەوە، تۆکمەو توندو تۆڵ بین، تاکو مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ دەورووبەری خۆماندا بکەین.

## بڕگەی چوارەم:

## با بە تۆكمەیی و هێزو پێزو سەرڕاستیی، مامەڵە لەگەڵ پەرلەمان و حكوومەت و دام و دەزگاكانیاندا بكەین:

بۆ ئەم مەبەستەش، پێویستە ڕەچاوی ئەو بنەمایانە بكەین:

١- پێویستە پەیوەندییە سیاسییەكانمان هاوسەنگ و تەریب بن و، زۆر وریا بین لە: بوونە لایەنگر و (بوونە پارسەنگ) لە تا تەرازووی هێزە سیاسییە ناكۆكەكانداو، هەڵوێستە سیاسییەكانمان، هەڵقوڵاوی ئیرادەو قەناعەتی خۆمان بن.

٢- دەبێ پەیوەندییە سیاسییەكانمان لەگەڵ هەر هێزو لایەنێكدا، لەسەر بناغەی بەرژەوەندیی هاوبەش بنیات بنرێن.

٣- پێویستە لە كاری پەرلەمانییدا، هەوڵی وەدەست هێنانی كورسی زیاتر بدەین، هەرچەندە لە هەڵبژاردنەكاندا، غەش و خیانەت و فرت و فیڵی گەورە دەكرێ، بەڵام نابێ مەیدانەكە چۆڵ بكەین.

٤- هەركات لە حكوومەتدا بەشداربووین، دەبێ لەسەر بناغەی خزمەتگوزاریی و دەوڵەتداریی مامەڵە بكەین و، ئەگەر

ئۆپۆزسیۆن بووین، دەبێ بەباش بڵێین باش و بە خراپ بڵێین خراپ و، لەگەڵ مافی هەر لایەن و کەسێك و، دژی ستەمی هەر کەس و لایەنێك بین.

٥- دەبێ لە پرۆژەو کاری گشتییماندا گشتگیر بین و داکۆکیکاری بەرژەوەندیی هەموو لایەك بین، مادام پێچەوانەی بنەما شەرعییەکان نەبێ، بە دڵنیاییش هیچ بنەمایەکی شەریعەت، دژو پێچەوانەی هیچ بەرژەوەندییەکی ڕاستەقینە نیە.

٦- هۆشیارکردنەوەو ئاراستەکردنی هاووڵاتیان، لە بارەی بارودۆخی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، کە ڕووبەڕوویان دەبنەوەو وێڵ نەکردنی خەڵك و پشتگوێ نەخستنیان و هاوکارو دەستبارگر بوونیان و، بەشداریی کردنی خۆشیی و ناخۆشیی و ئێش و ژان و موعاناتیان.

٧- نابێت چەقبەستووبین لە ڕووی سیاسییەوە، بەڵکو پێویستیمان بە موداراو لێزانیی و دووربینیی هەیە، تاکو لە پرۆسەی سیاسیی نێوەندە سیاسییەکەدا، سەرقافڵە بین و نەبینە پاشکۆو لاساییکەرەوەی ئەم و ئەو.

٨- پێویستە زۆر وریای پاراستنی هاوسەنگیی بین لە نێوان چۆنیەتیی و چەندایەتیی (کیفیة و کمیة) کە بێگومان هەردووکیان پێویستن و، هیچ کامیان جێگرەوە (بدیل)ی ئەوی

دیكە نیە، چونكە بەبێ ڕەچاوكردنی جۆرو چۆنیەتیی، قەبارەی گەورەو ژمارەی زۆر، بە تەنیا هیچی پێ ناكرێ، وەك واقیعی ئێستای مسوڵمانان شایەدە، بەڵام جۆرو چۆنیەتییش هەرچەندە یەكجار مومتازو نایاب بێ، بەبێ قەبارەو ژمارەی پێویست و گونجاو بۆ هەر كارێك، بەرهەم و بڕشتی نابێ، خوای زاناو تواناش هەردووكیانی بە مەرج گرتوون بۆ سەركەوتن، وەك فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ... ﴿٦٥﴾﴾ الأنفال،

واتە: ئەی پێغەمبەر! بڕواداران لەسەر جەنگ (و فیداكاریی) هانبدە، ئەگەر ئێوە بیست (جەنگاوەر)ی خۆڕاگرتان هەبن، بەسەر دووسەد كەس دا (لە دوژمن) زاڵ دەبن...

ئاشكراشە وشەی بیست كەس (عشرون) چەندێتیی (كمية) و وشەی خۆڕاگران (صابرون)ش چۆنیەتیی (كيفية) دەگەیەنن.

٩- شتێكی سەلمێنراو و نكوولّیی لێ نەكراوە، كە پسپۆڕیی (تخصص) و شارەزایی، تواناو بڕشت و بەرهەممان لەسەرجەم كارو چالاكییەكانماندا زۆر زیاد دەكات، كەواتە: دەبێ زۆر بە جیددیی لە دابەشكردن و پێ سپاردنی كاروبارەكاندا، ڕەچاوی شایستەیی و لێزانیی و كارامەیی بكەین.

١٠- هیچ گومانی تێدانیە کە تەبایی و پێکەوە گونجاویی و یەکدی بەهێزکردن و تەواوکاریی (تكامل) مایەی هێزو پێزو تۆکمەیی و، بە پێچەوانەوەش: نا تەبایی و گرژیی و نارێکیی و ناکۆکییش، هۆکاری بێهێزیی و بۆشیی و قرپۆکیی هەر ئیش و کارێکە، بۆیەش خوا فەرموویەتی:

﴿... وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦﴾ الأنفال،

واتە: پێکەوە ناکۆك و ناتەبا مەبن، ئەگەرنا بێهێزو شکستخواردوو دەبن و، هێزو پێزتان نامێنێ و خۆڕاگریش بن، مسۆگەر خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە.

هەڵبەتە هەتا ئێستاش کۆمەڵی ئیسلامیی کەم و زۆر ئەو بنەمایانەی تێدا ڕەچاوکراون و، تۆکمەیی و هێزو پێزو دامەزراوەیی و خۆڕاگرییەکەیشی، پاش پشتیوانیی خوای بەرزو مەزن، هەر بەو هۆیەوە بووە.

**لە کۆتـــــایی دا:**

پوختەی مەبەست: کۆمەڵی ئیسلامیی زادە و بەرهەمی ئێمەی پێکهێنەرانیەتی، بۆیە ئێمە چۆن بین، کۆمەڵیش وادەبێ و، بەئەندازەی گۆڕان بەسەرخۆدا هێنانمان و خۆپاك و

چاككردن و، گەشە بەخۆدانمان، كۆمەڵەكەشمان پاك و چاك و گەشە سەندوو و بەرەو پێشچوو دەبێ.

بەو هیوایەی هەركامێكمان لە خودی خۆیدا و هەمووشمان وێكڕاو و تێكڕا هەرچی زیاتر بەهۆی ئیمان و زانست و زانیاریی و تەزكیە و تەقواو لێزانیی و كارامەیی و ساغیی و دڵسۆزیی و ئەمینداریی و فیداكاریی و... هتدەوە، شایستەیی بەهێز و پێزتركردن و فراوانكردنی كۆمەڵی ئیسلامیی و تەوژمی ئیسلامیی و، كردنی بەچەتر و سێبەر و فریادڕەسی كۆمەڵگایەكەمانمان هەبێ.

# نێوەڕۆک




ئەم زنجیرەیە، ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان بەشێوەی نامیلکە دەریدەکات، گرنگی بە پێگەیاندنی ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵی ئیسلامیی دەدات لە بەرفراوانکردنی ئاسۆی ڕۆشنبیری و برەودان بە بەرزکردنەوەی ئاستی مەعریفی و هۆشیاریان و پێشخستنی چۆنایەتی ئۆرگانەکان لەسەر بنەمای گرنگی و پێویستی قۆناغەکە.


www.alibapir.net


AliBapir/عەلی باپیر


AliBapir1

COVER DESGIN 07504808081